بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

أحق ما ابتدأت به الكلام: الحمد لله مولانا الكريم، وأجل الحمد ما حمد به الكريم نفسه، فأنا أحمده به: ﴿الحَمدُ لِلَّهِ رَبِّ العالَمينَ ۝٢ الرَّحمٰنِ الرَّحيمِ ۝٣ مالِكِ يَومِ الدّينِ ۝٤﴾ [سورة: الفاتحة]

و ﴿الحَمدُ لِلَّهِ الَّذى لَهُ ما فِى السَّماواتِ وَما فِى الأَرضِ وَلَهُ الحَمدُ فِى الآخِرَةِ ۚ وَهُوَ الحَكيمُ الخَبيرُ ۝١ يَعلَمُ ما يَلِجُ فِى الأَرضِ وَما يَخرُجُ مِنها وَما يَنزِلُ مِنَ السَّماءِ وَما يَعرُجُ فيها ۚ وَهُوَ الرَّحيمُ الغَفورُ ۝٢﴾ [سورة: سبأ]

و ﴿الحَمدُ لِلَّهِ الَّذى خَلَقَ السَّماواتِ وَالأَرضَ وَجَعَلَ الظُّلُماتِ وَالنّورَ ۖ ثُمَّ الَّذينَ كَفَروا بِرَبِّهِم يَعدِلونَ ۝١﴾ [سورة: الأنعام]

و ﴿وَقُلِ الحَمدُ لِلَّهِ الَّذى لَم يَتَّخِذ وَلَدًا وَلَم يَكُن لَهُ شَريكٌ فِى المُلكِ وَلَم يَكُن لَهُ وَلِىٌّ مِنَ الذُّلِّ ۖ وَكَبِّرهُ تَكبيرًا ۝١١١﴾ [سورة: الإسراء]

أحمده شكرا لما تفضل به علينا من نعمه الدائمة، وأياديه القديمة، حمد من يعلم أن مولاه الكريم يحب الحمد، فله الحمد على كل حال، وصلى الله على البشير النذير السراج المنير، سيد ولد آدم عليه السلام، المذكور نعته في التوراة والإنجيل، الخاتم لجميع الأنبياء، ذلك محمد ﷺ وعلى آله الطيبين، وعلى أصحابه المنتخبين، وعلى أزواجه أمهات المؤمنين، يرزقنا الله وإياكم التمسك بطاعته، وبطاعة رسوله ﷺ، وبما كان عليه صحابته والتابعون لهم بإحسان، وبما كان عليه

الأئمة من علماء المسلمين، وعصمنا وإياكم من الأهواء المضلة، إنه سميع قريب[1].

لەکاتی دیراسەی یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی ئوممەی ئیسلام کە بریتی بوو لە سنن الترمذي تێبینیم کرد لە مسائلە فقهیەکان بەشێوەیەکی زۆر ووردو دەقیق ڕوو چۆتە نێو باسەکان بەجۆرێک لە هەر مسائیلێک دوو شتی زۆر گرنگ باسدەکات وە ئاماژە پێدەکات ئەوانیش:

١. کارپێکردن بەو حدیثة
٢. اجماعي زۆرینەی سەلەف دەگوازێتەوە لەسەری

ئەمە زۆر گرنگە چونکە ئیمامی الترمذي خۆی سەلەفە بۆیە ئیجماعەکەی وە ڕوونکردنەوەی مسائیلەکان پێویستە بەووردی دیراسە بکرێت.

وە تێبینیم کرد ئەو کتێبە دەرگایەکە بۆ گەڕانەوە بۆ فقهی سەلەفی ئوممەت وە ئەڕائەکانیان وە باسکردنی هەندێ ئیمام کەوا بەلانراون وەک (الأوزاعي، سفيان الثوري، إبن المبارك و ئەهلی کوفە و کۆمەڵێک لە تابعين و کەسانی تر...)، دەتوانم بڵێم کۆکەرەوەی ئەقوالەکانیانە، وە خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە ئیمامی الترمذي ئیجماعێکی شکلی و بێ ناوهێنانی هاوەڵان نەقڵ دەکات بۆیە ئەم شتە پێوستی بە لێ ووردبوونەوەیە، چوونکە ئەو ئیمامە ثقة و حجة و ئیمامە، ئەوەی لەو کتابە هەبوو لەکتوبەکانی تر بەهیچ جۆرێک بەو شێوە نەبوو وە نەم بینیوە، بۆیە بۆ ئاشنابوونی موسڵمان وە بۆئەوەی ڕووبکەنەوە بۆ لای ئەو کتێبە بەنرخانەی کەوا هەموو

---

(١) مقدمة كتاب الشريعة للآجري رحمة الله تعالى عليه.

تەمەنیان لەپێناو نوسـینی دانا بەڵام ئەمڕۆ فەرامۆش کراوە وە تۆزی لەسـەر نیشـتووە خۆ ئەگەر ئەوانەی دەیخوێننەوەش کەمێکیان نەبێت بەووڕدی و بەتدبر سەیری باسەکانی نێو ناکەن.

ئەو باسـە فقهیانە تەنیا سـەرچاوەی سـنن الترمذيم بەکار نەهێناوە بەڵکو هەر لەگەڵ دیراسەی ئەودا دیراسەیەکی زۆر ووردی کتوبی ئەحکام یاخود سـنن أبي داود دانەدانەی حدیثەکانیم کرد ولله الحمد ئەویشـم تێدا بەکار هێناوە لەگەڵ چەند، سـەرچاوەیەکی تری شروحاتی حدیث وەک: (معالم السـنن للخطابي ، عون المعبود ، وصحيح البخاري والمسلم و كتب الستة والتسعة).

باسەکان بۆئەوەیە بگەڕێنەوە بۆ خوودی ئیمامەکانی سەلەف وە لەوەش بگەن دەگمەن نەبێت ئیللا لە زۆرینەی مسـائلەکان زانایان اختلافیان هەبووە وە هەریەکەو پشت بەحجەی خۆی دەبەستێت.

**أبي عبدالله (كاروان كمال)**

# كتاب الصلاة

## یەکەم: ئەگەر یەکێک بۆنوێژ خەبەری نەبێتەوە؟

ئەنەس بن مالك (ﷺ) دەفەرموێت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "هەریەک نوێژی بیر کرد کاتێک بیری هاتەوە بابیکات". لەڕیوایەتێکی تر دەڵێت: "چونکە کەفارەتی نیە تەنیا ئەوە نەبێت"[1].

وە ئیمامی بوخاری و مسلم و ئەبو داود هێناویانە لە ژمارەیەک لە صحابیەوە بەم شێوە: لەسەفەریک پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی گەڕانەوەیان لەدۆڵێک دادەبەزن بەبیلال دەفەرموێ ئەمشەو تۆ بەئاگابەو بۆنوێژ خەبەرمان بکە، بەڵام نە پێغەمبەر و نەبیلال و نە هیچ یەک لە صحابەکان خەبەریان نابێتەوە تاخۆر هەڵدێ، لەهەندێ ڕیوایەت دەڵێت بەگەرمایی خۆر بەخەبەر دێن دوای خەبەر هاتن دەست نوێژ دەشۆن و فەرمان بەبیلال دەکات بانگ بدات دوو ڕکعاتی پێش نوێژ دەکەن دواتر قامەت دەکەن و دواتر نوێژی بەیانی دەکەن دوای سەلام دانەوە پێیان دەفەرموێ هەریەک خەبەری نەبۆوە یان بیری کرد بابیکات هەرکات بیری هاتەوە، الخ الحديث.

ئەم حدیثە بەچەندان لەفز و ڕیوایەت لەچەندان ڕیوایەت هاتوە گەیشتووتە پلەی متواتر والله اعلم.

### ڕاجیایی زانایان لەسەر ئەم باسەدا:

ئیمامی ترمزی دەڵێت: ئەهلی علم اختلافیان هەیە لەسەر کەسێک کە نوێژی لەبیر دەچێت یان خەبەری نابێتەوە کاتێ بیری

(١) حديث صحيح ئیمامی بخاری بەژمارە ٥٩٧ وە مسلم ٦٨٤ وە ابو داود ٤٤٢ وە النسائی ٦١٣،٦١٤ وە الترمزی ١٧٨ ڕیوایەتیان کردووە.

دێتەوە یان خەبەری دەبێتەوە لەکاتی خۆر هەڵاتنە یان خۆر ئاوا بوونە، دەفەرموێ بەشێکیان دەڵێن ئەگەر کاتێ هەستا یان بیری کەوتەوە با نوێژەکەی بکات، ئەگەر کاتەکەش خۆر هەڵاتن یان خۆر ئاوابوون بێت، ئەوانیش ئیمامی ئەحمد و ئیمامی مالك و ئیمامی شافعی و ئیمامی ئیسحاق.

وە هەندێکیان دەڵێن نابێت هەتا خۆر ئاوا دەبێت یان هەڵدێت، وە لە ئیمامی علی یە وە (رضي الله عنه) لەبارەی کەسێک نوێژی بیر دەچێت دەڵێت: "با بیکات هەرکات بیری کەوتەوە گەر لەوەقتی خۆی بیت یان نا". کە ئەمە قەولی شافعی ئەحمد و ئیسحاقە.

وە ئەبی بکر (رضي الله عنه) دەفەرموێت: "ئەگەر کەسێک خەبەری نەبێت بۆنوێژ با نەیکات هەتا خۆر هەڵدێ یان ئاوا دەبێت"[1]. ئەوە قەولی بەشێکی لەزانایانی ئەهلی کوفەیە.

**والصواب هەرکات هەستا یان بیری کەوتەوە بابیکات.**

**دووەم: کەسێک بێ دەست نوێژ بانگ بدات؟**

ئیمامی ترمزی لە جامع الصحیح دوو حدیثی ڕیوایەت کردوە لە ابن شهاب الزهری ئەویش لە ئەبو هرێرە رضي الله عنه دەفەرموێ : "بانگ نادات تەنیا بەدەست نوێژ نەبێتن". لەڕیوایەتی دووەمیش بەم شێوەیە انتهی.

**فەرموودەکان بەم شێوە هاتوون:**

٢٠٠ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ ، قَالَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ يَحْيَى ، عَنِ الزُّهْرِيِّ ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: "لَا يُؤَذِّنُ إِلَّا مُتَوَضِّئٌ ".

(١) ئیمامی الترمزی لەشەرحی حدیث ١٧٨ باسی کردووە.

٢٠١ حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ مُوسَى ، قَالَ : حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ ، عَنْ يُونُسَ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ : قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ : لَا يُنَادِي بِالصَّلَاةِ إِلَّا مُتَوَضِّئٌ.

لەڕووی سەنەدەوە هەر دووکیان لەڕووی سەنەد رجالەکانیان ثقة ن وە ئیمامن تەنیا ئەوە نەبێت (منقطعة)، چونکە ابن شهاب نەگەیشتوە بە ئەبو هریرە هەروەها لە حدیثی یەکەم معاویە بن یحیی ی تێدایە کەوا لاوازە، والله اعلم .

**ڕاجیایی زانایان لەسەر ئەم باسەدا :**

ئیمامی الترمزی دەفەرموێ: "زانایان ڕاجیاییان هەیە لەسەر ئەوەی دەکرێ کەسێک بانگ بدا بێ دەست نوێژ:

هەندێکیان پێیان وایە ناکرێ وە نابێت بێ دەست نوێژ بانگ بدرێ ئەوانیش، ئیمامی شافعی و ئیمامی ئیسحاق بن ڕاهویە هەندێکی تریان دەڵێن دەکرێ و ئاسایە ئەوانیش ، سفیان الثوری ، عبدالله بن مبارك و ئەحمد بن محمد بن حنبل الشیبانی. انتهی"[1].

**کەواتە گەر بەدەست نوێژەوە بانگ بدەی باشترە وەبێ دەست نوێژیش بانگ بدەی ئاساییە و دروستە، والله اعلم.**

## سێیەم: کەسێک بەتەنیا دوای ڕیزی جەماعەت نوێژ بکات نوێژەکەی بەتاڵە؟

حدیثێکمان هەیە کەوا لە سنن أبی داود و سنن الترمزی هاتوە بەسەنەدی صحیح.

(١) سنن الترمزی ، حدیث ٢٠٠، ٢٠١

حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ وَحَفْصُ بْنُ عُمَرَ ، قَالَا : حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ ، عَنْ هِلَالِ بْنِ يِسَافٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ رَاشِدٍ، عَنْ وَابِصَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَأَى رَجُلًا يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ. قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ: الصَّلَاةَ.

له وابصـة بن معبد ەوە دەفەرموێت: "پیاوێک نوێژی کرد بەتەنیا لەدوای ڕیز پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکرد دووبارەی بکاتەوە"[١].

**ڕاجیایی زانایان لەسەر ئەم باسەدا:**

بەشێکیان پێیان وایە نابێت نوێژ بەتەنیا لەدوای ڕێز بکرێ، وە ئەگەر کردی دەبێت دووبارەی بکاتەوە ئەوانیش، ئیمامی ئەحمد و ئیمامی ئیسحاق.

وەهەندێکیان ڕایان وایە کە، دەکرێ ئەگەر نوێژی بەتەنیا کرد دوای ڕێز، لەوانە سفیان الثوری، عبد الله بن مبارك و شافعی.

ئیمامی ترمزی دەفەرموێت: "بەشێک لەئەهلی کوفە دەچنە سەر حدیثی وابصة کەوا هەر یەک نوێژی دوای ڕێز کرد بەتەنیا دەبێت دووبارەی بکاتەوە ئەوانیش، حماد بن أبی سلیمان، ابن أبی لیلی و وکیع بن جراح". وە دەڵێت گوێم لە الجارود بوو دەیفەرموو گوێم لە وکیع بوو دەیفەرموو ئەگەر نوێژی کرد دوای ڕێز ئەوا دەبێ دووبارەی بکاتەوە[٢].

**والصواب ئەگەر پێی کرا هەتا بتوانێت بچێتە ڕێز، والله اعلم.**

(١) الترمزی لە سنن بەژمارە ٢٣٠، ٢٣١، وە الدارمی بەژمارە١٣٢٢، ١٣٢٣ وە ابن ماجە ١٠٠٤ وە لەمسند احمد بن حنبل ١٨٠٠٠ و زیاتریش.

(٢) جامع الصحیح للترمزی حدیث ٢٣١.

**چوارەم: کێ بۆی هەیە ببێتە ئیمام و پێش نوێژ بکات؟**

ئەبو مسعود البدری ﵁ دەفەرموێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: " ئیمامەتی دەکات ئەو کەسەی زۆرترین قورئانی لەبەرە بەخوێندن وە ئەگەر لەوەشدا هاوبەش بوون شارەزاترینیان بە سونەت وە ئەگەر لەوەشدا هاوبەشبوون ئەوا لەپێشترینیان لە هجرەت وە ئەگەر لەوەشدا هاوبەش بوون بەتەمەنتری دەبێتە ئیمام[1].

واتە ئەگەر چەند کەسێک بوون دەبێ کامیان زیاتر قورئانی لەبەر بوو وە بەسونەت شارەزا تربوو ئەوەیان دەبێت پێش نوێژ بکات. نابێ بڵێن فڵان گەورەترە لە حدیثەکان لەکۆتاییدا باسی تەمەن دەکات، دوای ئەوەی لەهەموو شت یەکسان بن.

ئیمامی ترمزی دەفەرموێ: ئەوە کارپێکراوە لای کۆمەڵێک لە ئەهلی علم بەوەی ئەوکەسەی شارەزاترە بەسوننەت و قورئانی زیاتر لەبەرە حەقی ئیمامەتی هەیە[2].

**ڕاجیایی زانایان لەسەر ئەم باسەدا:**

عطاء بن أبی رباح دەڵێت : پێش نوێژی دەکات شارەزاترینیان بەفقهـ وە ئەگەر لەڕووی فقهـەوە یەکسان بوون ئەوا شارەزاترینیان بەخوێندنەوەی قورئان وە ئەگەر لە فقهـ و قرائات وەک یەک بوون ئەوا بەتەمەنترینیان.

ئیمامی مالك دەفەرموێت: پێش دەکەوێت بۆ ئیمامەتی شارەزاترینیان ، گوتیان ئەوەی کە شارەزایە بەخوێندنەوە ، فەرمووی کەسی وا هەیە دەخوێنێت بەڵام لێی ڕازی نین ، قلت ،القائل أبی

(١) ئەم حدیثە مسلم ریوایەتی کردووە بەژمارە ٦٧٣، ابی داود ٥٨٢، الترمزی ٢٣٥ – ٢٧٧٢، النسائی ٧٨٠- ٧٨٣، ابن ماجە ٩٨٠، هاتوون وە ئیمامی ئەحمد لە مسند هێناویەتی.

(٢) سنن الترمزی حدیث ٢٣٥

عبدالله : مەبەستی لەوەیە شارەزاترینیان بە سونەت و فقهــ و قورئان نەک خوێندنەوە وەک دەڵێت کەســانێک دەخوێننەوە کەلێی ڕازی نین. واتە لەوانەیە کە تێگەیشتوو نەبێت یان لەسەر سونەت نەبێت واللە أعلم.

ئیمامی الأوزاعی دەفەرموێت : پێش نوێژی دەکات أفقهھم (تێگەیشتووترینیان).

ئیمامی الشافعی دەفەرموێت : ئەگەر لەکەسێکدا خوێندنەوەو فقهـ وتەمەن کۆنەبێتەوە ئەوا فقیهترینیان پێش دەکەوێت بۆ ئیمامەت، ئەگەر بێت خوێندنەوەی بەقەدەر پێویستی بێت بۆ نوێژ ، وەئەگەر شارەزاترینیان بەخوێندنەوە پێش کەوت کە بەقەدەر پێش نوێژ شارەزابێت بەفقهـ ئەوا باشە.

وە أبو ثور: دەڵێت : پێش نوێژی دەکات فقیهترینیان ئەگەر قورئان بخوێنێت ئەگەر چی هەمووی نەخوێنێت.

وە هەریەک لە سفیان الثوری واحمد بن حنبل و اسحاق بن راهویة ڕووکەشی حدیثەکە وەر دەگرن لەسەر ئیمامەتی کەوا خوێندنەوە پێش دەخەن[1].

**پێنجەم: لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قیبلەیە؟**

ئیمامی ترمزی لە سنن لە (أبواب الصلاة لە باب ماجاء بين المشرق والمغرب قِبلة) ، بەژمارە (٣٤٠ – ٣٤١ – ٣٤٢)، هێناویەتی لە ئەبی هڕێرە وە رضي الله عنه ، دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "لەنێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا قیبلەیە".

(١) ئەمە الخطابی لەمعالم السنن لەشەرحی هێناویەتی وە لەعون المعبود لەشەرحی حدیثی (٥٨٢،٥٨٣،٥٨٤) لەکتاب الصلاة هێناویەتی.

**لە ڕووی سەنەدەوە:**

حدیثی یەکەم و دووەم (محمد بن ابی معشر) ئەویش لەباوکی (باوکی ئەهلی حدیث بەلاوازیان داناوە)، بەڵام لەسێیەم سەنەدی بەهێزترە، والله أعلم.

**ڕوونکردنەوەی ئەم باسە لەلایەن ئیمامی الترمزی:** ئیمامی ترمزی دەفەرموێ: "لە کۆمەڵێک لە أصحابی پێغەمبەر ﷺ هاتووە کەوا لەنێوان ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا قیبلەیە لەوانیش هەریەک لە ئیمامی عمر و ئیمامی علی و عبدالله بن عباسەوە".

وە عبد الله بن عمر دەفەرموێ: "ئەگەر ڕۆژ ئاوا لەلای ڕاستت بوو وە ڕۆژ هەڵات لەلای چەپت بوو ئەوا ئەوەی لەنێوانیانە هەمووی قیبلە یە".

وە عبدالله بن مبارك دەفەرموێ: "لەنێوان مغرب و مشرق قیبلەیە ئەوەیان بۆ ئەهلی ڕۆژ هەڵاتە، واتە کەمێک خواری و نارێکی وەستان کاریگەری نیە وەستانت لەنێوان ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا بەجۆرێک بێت ئەوی تر دەبێتە قیبلە". لە جامع الصحیحی الترمزی لە أبواب الصلاة هاتووە.

## شەشەم: نوێژی سەفەر چیە و چۆنە و لەماوەی چەند و بۆماوەی چەند ڕۆژ دەکرێت؟

یەکێک لە سونەتەکان لەئیسلام دا و لەپێناو بەرژەوی مسڵمان بەهۆی نارەحەتی سەفەر بریتیە لە کورت کردنەوەی نوێژ.

لە حدیثی صحیح کەوا بخاری و ئەبو داود و کۆمەڵێکی تر ڕیوایەتیان کردوە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: "

[ السـفر قطعة من العذاب ] سـەفەر کردن بەشـێکە لەئازار و ناڕەحەتی کە مرۆڤ لەکاتی سەفەر تووشی دەبێت" .

بۆیە خوای تعالی دەفەرموێ : [ یرید الله بکم الیسر ] .

وە لە حدیثی صحیح کەوا هەریەک لە ئیمامی ئەبوداود و ئیمامی ترمزی بەسەنەدی صحیح ڕیوایەتیان کردووە، صحابی بەڕێز یعلی بن أمیە پرسـیاری لە ئیمامی عمر ﷛ کرد و فەرمووی: " ئایا نابینی خەڵک نوێژ کورت دەکەنەوە لەکاتێکدا خوای تعالی دەفەرموێ :[إن خفتم أن یفتنکم الذین کفروا ...] وا دەبینی ئەمڕۆژەش بەسەر چوو؟

ئیمامی عمر دەفەرموێ ئەوەی تۆ سـەرت لەبارەوە سـوڕماوە منیش بەهەمان شێوە بۆیە ئەوەم بەبیری پێغەمبەر هێناو بۆم باس کرد فەرمووی ئەوەیە صدقەیەکە لەلایەن خوای تعالی بۆ ئێوە ئێوە قبوڵی ئەو صدقەیە بکەن ".

عبدالله بن عمر ﷞ دەفەرموێ: "سـەفەرم لەگەل پێغەمبەر ﷺ و أبو بکرو عمر و عثمان کرد نوێژیان دووڕکات دەکرد نەپێش نەپاش سـوونەتیان نەدەکرد ، عبدالله دەڵێت ئەگەر نوێژی پێش و پاش بکەم ئەوا نوێژەکە بەتەواوی دەکەم". حدیثی صـحیحة أبوداود و ترمزی و بخاری ڕیوایەتیان کردووە[١].

**لەدووری چەند نوێژی سەفەر دەکرێت؟**

أنس بن مالك ﷛ دەفەرموێ: " پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کورت دەکرد ئەگەر بڕۆیشتبایە بۆماوە سی فرسخ یان میل".

---

(١) بخاری، ١١٠٢،١١٠١،مسلم ٦٨٩ ،ابی داود ١٢٢٣، النسائی ٤٥٧، الترمزی ٥٤٤ وە ئیمامی ئەحمد لەمسند و ابن ماجە لەسنن هێناویانە.

(میلیش هێندەو نیوی کیلۆمەترە).

هەروەها أنس دەفەرمویٚ: "لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆمان چوار رکعات کرد لەمدینە بۆعەسر لە ذی الحلیفة دووڕکعاتمان کرد"(١).

**بۆماوەی چەند ڕۆژ دەتوانی لەسەفەردا نوێژ کورت بکەیتەوە؟**

أنس بن مالك ﷺ دەفەرمویٚ: "لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرچووین بۆ سەفەر نوێژی کورت دەکردەوە بۆ [رکعتین رکعتین] بە أنس گوترا ماوەی چەند ڕۆژ لەو سەفەرە ماوە، واتە لەمککە ؟ فەرمووی دە ڕۆژ"(٢).

عبدالله بن عباس دەفەرمویٚ: "پێغەمبەر (ﷺ) سەفەری کرد بۆماوەی نۆزدە ڕۆژ نوێژی کورت دەکرەوە بۆ دوو ڕکعات".

ئیمامی عبدالله دەڵێت: "ئێمە لەنێوەندە نوێژمان دەکرد ئەگەر زیاتر بمانایەوە نوێژەکەمان تەواو دەکرد"(٣).

**لەبارەیی ماوەی مانەوەی سەفەر و کورت کردن اختلاف هەیە لەنێوان زانایان:**

ئیمامی ترمزی ئەقوالی زانایانی لەسەر هێناوە لە جامع الصحیح بەم شێوەی خوارەوە:

(١) بخاری ،١٥٥١، ١٥٤٨، ١٥٤٧، ١٥٤٦ وە مسلم ٦٩٠، النسائی ٤٧٧، ٤٦٩، ابی داود ١٢٠٢ الترمزی ٥٤٦ وە الدارمی لەسنن واحمد بن حنبل لەمسند هێناویانە.

(٢) بخاری ،٤٩٢٩، مسلم ٦٩٣، ابی داود ١٢٣٣ الترمزی ٥٤٨ النسائی ١٤٣٨، ١٤٥٢، ابن ١٠٧٧ وە احمد لەمسند هێناویەتی.

(٣) بخاری ٤٢٩٨، ٤٢٩٩، ابن ماجە ١٠٧٥، الترمزی ٥٤٩ وە مسند احمد.

- عبدالله بن عمر دەڵێت: نوێژ کورت دەکرێت بۆماوەی پانزە ڕۆژ ئەگەر بمێنێتەوە. وەڕیوات کراوە لەو بۆ ماوەی دوازدە ڕۆژی مانەوەش.
- لە ئیمامی علی ڕیوایەت کراوە بۆ ماوەی دەڕۆژ، دوای مانەوە نوێژەکەی تەواو دەکات.
- تابعی بەڕێز سعید بن المسیب دەڵێت: ئەوەی بۆماوەی چوار ڕۆژ بمێنێتەوە چوار ڕکعات تەواو دەکات. وە قتادە و عطاء الخراسانی لێیان ڕیوایەت کردووە .
- بەڵام ئەهلی کوفە و سفیان الثوری دەڵێن: ئەگەر ماوەی مانەوەی پانزە ڕۆژ بوو دەبێت نوێژەکەی تەواو بکات.
- ئیمامی الأوزاعی دەڵێت : مانەوەی دوانزە ڕۆژ.
- هەریەک لەئیمامی مالك و شافعی و أحمد دەڵێن: ئەگەر ماوەی مانەوەی چوار ڕوژ بوو دەبێت نوێژەکەی تەواو بکات.
- بەڵام ئیمامی ئسحاق بن ڕاهویە بۆ حدیثی ابن عباس دەچێت کەوا نۆزدە ڕوژە وەک ئیمامی الترمزی دەڵێت بۆ چاکترین مذهب دەچێت کەوا نۆزدە ڕۆژە پاڵپشت بەو حدیثە[1].

## حەوتەم: نوێژی جمع یان کۆکردنەوەی نوێژ

**ئایا دەتوانین لەکاتی چونە ماڵان نوێژ جمع بکەین یان چوونە بازاڕ کردن؟**

کۆکردنەوەی نوێژ یەکێکە لە سوننەتەکان چەندان حدیثی لەسەر هاتووە بەشێوەی متواتر هیچ مجالی ڕەفز کردنی نیە، لەچەندان صحابی وەکو معاذ بن جبل و أنس بن مالك و عبد الله بن عباس و عبدالله عمر و جابر بن عبدالله، هەروەها لەچەندان

(١) سنن الترمزی لە تعلیقی حدیثی ٤٥٨ ئاماژەی بەم اختلافاتە کردووە.

صحیح و سنن دا هاتوە وەکو صحیح بخاری ، صحیح مسلم ، سنن ابی داود، سنن الترمزی ... الخ.

معاذ بن جبل ﷺ دەفەرموێ: "پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی تبوک دا ئەگەر بەڕێکەوت پێش ئەوەی خۆر بکەوێتە نێوەڕاست زیغ یان زالت بێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆی تاخیر دەکرد و پێکەوە لەگەڵ عەسر دەیکرد، ئەگەر خۆر بگاتە نێوەڕاست لەکاتی ڕۆیشتن نوێژی عەسری دەهێنا پێش و لەگەڵ نیوەڕۆ دەیکرد، وەبۆ مەغریبیش بەهەمان شێوە ئەگەر غاب أو غربت الشمس پێش ڕۆیشتن بێت واتە پێش مغریب بەڕێکەوتبا نوێژی مەغریبی لەگەڵ عیشا دەکرد ئەگەر دوای مغریب بەڕێ کەوتبا نوێژی عیشای دەهێنا پێش و لەگەڵ مەغریبی دەکرد"[١].

بەهەمان شێوە لەکۆمەڵێک صحابی ترەوە هەروەها حدیثکمان هەیە لە صحیح و سننەکان هاتوە وەک بخاری و مسلم و ئەبو داود و ترمزی، لە عبدالله بن عباس ﷺ دەفەرموێ: "پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆکردەوە ، وە نوێژی مغریب و عیشا لەمدینە لە (حضر) من غیر خوف ولا مطر: واتە نەهیچ ترسێک هەبوو نە باران بارینیش بوو".

**زانایان لەسەر ئەم حدیثە بۆچونی جیاوازیان هەیە:**

ئیمامی الترمزی دەڵێت: "یەکێک لەو حدیثانەی کەوا اجماعی ئەهلی علمی لەسەرە لەسەر کار پێ نەکردنی ئەو حدیثەی ابن عباسە". بەڵام نووی لەمنهاج وەڵامی دەداتەوە بەوەی نەخێر اجماعی لەسەر نیە کار پێ نەکردنی.

(١) ابی داود ، ١٢٠٨، ١٢٢٠ . الترمزی ،٥٥٣،٥٥٤.

خطابی لە معالم السـنن دەڵێت: "ئەو حدیثة زۆربەی زانایان وەری نـاگرن، بەڵام هەنـدێکی وەری دەگرن، وەک: ابن منـذر، وە ئەبوئیسحاق المروزی لە محمد بن سیرینەوە دەڵێت ئاساییە.

کۆکردنەوەی نوێژ بۆ پێویستیەک بەڵام نەک بکرێت بەعادەت، بەڵام هەندێکی تر دەڵێن ئاساییە بۆ کەسێکی نەخۆش کەوا (جمع بین الصـلاتین) بکات کە هەریەک لە ئیمامی ئەهلی حرم و مککە عطاء بن أبی رباح دەڵێت ئاسـاییە وە ئیمامی ئەحمد و ئیمامی مالك بەهەمان شێوە.

وە أصحاب الرأی ، ڕێگایان داوە بۆ نەخۆش بۆ کۆکردنەوەی نوێژ، وە ئیمامی شـافعی ، ڕێگەی نەداوە بەکۆکردنەوەی نوێژ لەکاتی حاضر دا تەنیا باران بارین نەبێت[1].

**هەشتەم: ئایا دروستە لەدوای نوێژیان دووعا دەست بەدەمو چاوماندا بهێنین؟**

لە سائب بن یزید ئەویش لەباوکی دەفەرموێت: "پێغەمبەر ﷺ کاتێ دووعای دەکرد دەسـتی بەرز دەکردەوە وە بەدەسـتی وەجهی مسح دەکرد".

**دەقی حدیث بە عەرەبی:**

(حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ ، حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ ، عَنْ حَفْصِ بْنِ هَاشِمِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ، عَنِ السَّـائِبِ بْنِ يَزِيدَ ، عَنْ أَبِيهِ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا دَعَا فَرَفَعَ يَدَيْهِ مَسَحَ وَجْهَهُ بِيَدَيْهِ)[2].

(١) ئەم شەرحەی سەرەوە لە هەمان حدیث لە سنن الترمزی وە لە هەمان حدیث لەعون المعبود هاتوە.

(٢) سنن أبی داود – کتاب الصلاة – ١٤٩٢

ئەم حدیثة ضعیفة ، (عبدالله بن لهیعه)ی تێدایه ، زۆربەی متقدمین و متأخرین تضعیفیان کردووه وەکو : (أحمد بن حنبل ، أبو حاتم الرازی، النسائی ، البخاری ، یحیی ، الدار قطنی ، الذهبی ، ابن حجر) هەروەها لە سەنەدی دا [ حَفْصِ بْنِ هَاشِمِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ] مجهوله.

وە حدیثێکی ترمان هەیە لە سنن ابن ماجه لەکتاب إقامه الصلاة، لە ابن عباس ﵄ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "ئەگەر دوعات کرد ئەوا (بە ناو لەپت) بیکە نەک بە ڕووی دەرەوەی، وەکاتێک تەواو بوویت ئەوا (ڕووت یان دەم و چاو یان وجهـ) پێ مسح بکە". (واتە دەستت بەدەم و چاوت دا بهێنە).

**دەقی حدیث بە عەرەبی:**

حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ ، وَمُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ ، قَالَا : حَدَّثَنَا عَائِذُ بْنُ حَبِيبٍ ، عَنْ صَالِحِ بْنِ حَسَّانَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : " إِذَا دَعَوْتَ اللَّهَ فَادْعُ بِبَاطِنِ كَفَّيْكَ، وَلَا تَدْعُ بِظُهُورِهِمَا، فَإِذَا فَرَغْتَ فَامْسَحْ بِهِمَا وَجْهَكَ ".

**تحقیق:**

ئەم حدیثة ضعیفة بەهۆی ، [صَالِحِ بْنِ حَسَّانَ الْأَنْصَارِيِّ]

- البخاری دەڵێت ، منکر الحدیث
- أبو حاتم الرازی ،دەڵێت ، منکر الحدیث
- أبو زرعة الرازی دەڵێت ، ضعیف
- أحمد بن حنبل دەڵێت هیچ نیه
- النسائی دەڵێت ، متروك الحدیث

- الدارقطنی دەڵێت ، ضعیف
- ابو داود السجستانی دەڵێت ، ضعیف.
- الذهبی لە الکاشف دەڵێت ، ضعفوه جماعة
- ابن حجر العسقلانی ، دەڵێت ، متروکه.

هەروەها بەســەنەدێکی تر لە ســنن أبو داود هاتووە لە [کتاب الصلاة – حدیثی ١٤٨٥ ] : (حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ أَيْمَنَ ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ ، عَمَّنْ حَدَّثَهُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ ) ئەوە سەنەدەکەیە.

- بەڵام [عبدالملك بن محمد بن أيمن] ، مجهوله .
- هەروەها ، [ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ ] مجهوله.
- وە ئیمامی ئەبو داود دەڵێت ، هەموویان لە محمد بن کعب ، کە هەموویان بە لاوازی هاتوون ، والله اعلی وأعلم.

کەواتە هیچ حدیثێکمان نیە هاتبێت بە صــحیحی کەوا بڵێت دەست هێنان بە سەرو ڕوو دەبێت بکرێ دوای دوعا یان دوای نوێژ بۆیە جائیز نیە ئەوەی هەیە تایبەتە بە وێردی شــەوان یان خەوتنان دوای خوێندنی المعوذتين پێغەمبەر دەستی بە جەستەی دادەهێنا.

**نۆیەم: مەرجە ئەوەی مەیت بشوات یان هەڵیبگرێت غوسلی خۆی بکات؟**

حدیثێکمان هەیە بەچەند ڕێگایەک هاتوون لەڕیوایەتی ئیمامی ترمزی بەو شێوە هاتووە : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ : " مِنْ غُسْلِهِ الْغُسْلُ، وَمِنْ حَمْلِهِ الْوُضُوءُ "[١].

(١) الترمزی ، ٩٩٣ ، ابی داود، ٣١٦١ ، ابن ماجه ،١٤٦٣ ، وەمسند احمد بن حنبل.

واتە ئەوەی مەیتەکە دەشــوات غوســـل دەکـات ، وەئەوەی هەڵیدەگرێت دەستونوێژ دەشوات .

**لە ڕیوایەتی ئیمامی ئەبوداد بەم شێوە هاتووە:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُــولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ : " مَنْ غَسَّـــلَ الْمَيِّتَ فَلْيَغْتَسِلْ، وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ "(١).

واتە: ئەوەی مەیتەکە دەشـوات دەبێت خۆی بشـوات و ئەوەی هەڵی دەگرێت دەبێت دەست نوێژ بشوات.

**لەڕیوایەتی ابن ماجە بەو شێوە هاتووە:**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : قَالَ رَسُــولُ اللَّهِ ﷺ : " مَنْ غَسَّـــلَ مَيِّتًا فَلْيَغْتَسِلْ "(٢).

ئەوەی مەیت بشوات دەبێ غوسل لەخۆی دەربکات .

ئیمامی ئەبو داود لە ســنن بەژمارە (٣١٦١) دەڵێت، ئەو حدیثە منسوخە واتە حوکمی نسخ بۆتەوە . وە دەفەرموێ پرسیارم لە أحمد بن حنبـل کرد لەو بـارەوە واتە ئەوەی مەیـت بشــوات غوســـل دەربکات؟

فەرمووی: تەنیا شوشتنی دەست نوێژ بۆی بەسە(٣).

وە خطابی لە معالم السنن دەفەرموێ : "نەمزانیوە هیچ یەکێک لە زاناو فوقەهایان غوسلیان لەسەر ئەو کەسە واجب کردبێت کەوا مەیت دەشوات وە دەست نوێژ لەسەر ئەوەی کەوا هەڵیدەگرێت"(٤).

---

(١) ابی داود، ٣١٦١

(٢) ابن ماجە ،١٤٦٣

(٣) سنن ، حدیث ٣١٦٢

(٤) معالم السنن ، شەرحی حدیث ،٣١٦١

وە ئیمامی الترمزی لە جامع الصحیح دەفەرموێت: "ئەهلی علم لەسەر غوسل کردنی ئەوکەسەی مەیت دەشوات

اختلافیان تێکەوتوە ، هەندێکیان لە أصحاب النبی دەڵێن، ئەگەر غوسلی مەیتی کرد ئەوا غوسلی لەسەر واجب دەبێ وەهەندێکی تر دەڵێن ، تەنیا دەست نوێژ.

- هەریەک لە ئیمامی مالك وە ئیمامی شافعی دەڵێن لەبابی استحباب غوسل لەسەر ئەو کەسەیە کەوا مەیت بشوات نەک وەکو واجب.
- ئیمامی ئەحمد دەفەرموێ : "ئەوەی مەیت دەشوات ئومێد وایە غوسلی لەسەر واجب نەبێت ، بەڵام دەست نوێژ پێویستە".
- هەروەها وارد بووە لە عبدالله بن المبارك دەفەرموێ: "نەدەست نوێژ دەشوات نە غوسل لەخۆی دەر دەکات ئەو کەسەی مەیت دەشوات"[١].
- وە ئیمامی ئەحمد و علی ابن المدینی دەڵێن ، هیچ شتێک بە ثابتی لەو بابە جێگیر نەبووە.
- وە الذهلی دەفەرموێ : "نەمزانیوە (من غسل میت فلیغتسل) حدیثێکی ثابتی لەسەر هاتبێت ئەگەر هاتبوایە ئەوا واجب دەبوو ئێمە کاری پێ بکەین بەهەمان شێوە شافعیش وادەڵێت"[٢].

لەکۆتایی دا من دەڵێم لەکتوبەکانی الناسخ الحدیث ومنسوخە یەکێک لە حدیثەکان ئەوەیە وەک ئەبوداودیش فەرمووی وە غوسلیش واجب نیە بە اتفاقی فوقەهایی سلف.

(١) سنن الترمزی ، حدیث ٩٩٣

(٢) عون المعبود شەرحی حدیثی ٣١٦١

**دەیەم: ئەوکاتانەی نابێت مردووی تێدا بنێژرێت ئەمانەن:**

حدیثێکی صـــحیحمان هەیە کەوا هەریەک لە ئیمامی مســـلم و ئیمامی ئەبوداود و ئیمامی ئەحمد و ئیمامی الترمزی ڕیوایەتیان کردووە لە عقبة بن عامر الجهنی دەفەرموێت : "ســێ ســەعات هەن کەوا پێغەمبەر ﷺ نهی لێکردووە نوێژی تێدا بکەین ، وەمردووی تێدا بنێژین ئەوانیش، کاتێک خۆر هەڵدێت ســـەرەتا هەتا کەمێک بەرز دەبێتەوە وەکاتێک ڕۆژ لەنێوەڕاست دایە مرۆڤ سێبەری نابێت هەتا بەلایەک دادەچێت ، وەکاتێک خۆر بەرەو ئاوا بوونە هەتا بەتەواوی ئاوا دەبێت"(١).

ئیمامی الترمزی لە جامع دەفەرموێ : "کارکردن بەو باسە لای کۆمەڵێک لەئەهلی علم لە اصـــحاب النبی و کەســـانی تریش کەوا بەکەراهەتیان داناوە نوێژ کردن لەسەر مردوو لەو کاتانەدا".

ئیمامی ئیبن مبارك دەڵێت: "مانای ئەو حدیثة [ أن نقبر فیهن موتانا ] واتا نوێژ کردن لەسـەر جەنازە ، وە کاریشـیان بەو فەرموودە کردووە لەبارەی نوێژکردن لەسەر مردوو لەکاتی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا و لەنێوەڕۆدا، ئەمەش قەولی هەریەک لە ئیمامی ئەحمد و ئیمامی ئیسحاق بن ڕاهویە". (حدیث ١٠٣٠)

وە بەهەمـان شـێوە عبـدالله بن عمر بەکەراهیەتی دانـاوە نوێژ کردن لەســـەر مردوو لەکاتی خۆرهەڵات یان خۆر ئاوا وە لە (فتح الباری) دەڵێت هەریەک لە ئیمامی الأوزاعی و کوفیەکان و مالك و أحمد و إسحاق بەو قەولەیان وەرگرتوە(٢).

(١) مســـلم ٨٣١، ابی داود ٣١٩٢، الترمزی ١٠٣٠، النســـائی ٥٦٠، ٥٦٥، ابن ماجه ١٥١٩، الدارمی، ١٤٧٢، مسند احمد.

(٢) حاشیة السندی ابن ماجه ، ١٥١٩

بەڵام ئیمامی شـافعی دەڵێت: "هیچ شـتێکی تێدانیە نوێژ کردن لەســەر جەنازە لەو کاتانەی کەوا نوێژکردن تێیانداجائیز نیەونەهی لێکراوە[١].

هەروەها زۆربەی زۆری زاناو فوقەهایان بۆ ئەوەچوون کەوا نوێژ کردن لەسەر جەنازە لەوکاتانەی نوێژیان تێدا جائیز نیە ڕێگە پێ نەداوە وەک سـفیان الثوری و مالك و اوزاعی و احمد و ئیسـحاق و أصحاب الرأی[٢].

**یازدەیەم: منداڵ لەنێو سک بمرێ نوێژی لەسەر دەکرێت یان میرات؟**

حدیثێکمان هەیە بە ڕێگـای جیاواز هاتووە لە جابر بن عبدالله (رضي الله عنه)، بەم شێوانە لە سنن الترمزی، کتاب الجنائز.

حديث ١٠٣٢: حَدَّثَنَا أَبُو عَمَّارٍ الْحُسَــيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الْوَاسِطِيُّ ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ الْمَكِّيِّ ، عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ ، عَنْ جَابِرٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ : " الطِّفْلُ لَا يُصَــلَّى عَلَيْهِ، وَلَا يَرِثُ، وَلَا يُورَثُ حَتَّى يَسْتَهِلَّ."

واتە: منداڵ نوێژی لەســەر ناکرێت وە میرات وەرناگرێ و میراتی لێناگیرێـت هەتـا (یســتهـل) واتە دەنگی نەیەت ئەوکـاتەی لەدایک دەبێت، ئەم حدیثە صــحیح کراوە، بەڵام ضــعیفة چونکە [إِسْمَاعِيلَ بْنِ مُسْلِمٍ الْمَكِّيِّ] تێدایە.

- عمرو بن علی دەڵێت: "يحيى بن سعيد و ابن مهدی حدیثیان لێ ڕیوایەت نەدەکرد".

(١) سنن الترمزی

(٢) عون المعبود شەرحی حدیث ٣١٩٢

- يحيى بن معين دەڵێت ، ليس بشئ وە دەڵێ ضعيف
- أحمد بن حنبل دەڵێ ، منكر الحديث
- أبوزرعة الرازي ،دەڵێت ضعيف الحديث
- أبوحاتم الرازي ، ضعيف الحديث وليس بمتروك
- النسائي دەڵێت ،ليس بثقة وەضعيف
- الدار قطني دەڵێت ، ضعيف ، متروك
- اجماعی زانایان لەسەر ئەوەیە ضعيفة

هەروەها لەڕێگای سـنن ابن ماجه هاتووه لەكتاب الفرائض ٢٧٥٠ : حَدَّثَنَا هِشَـامُ بْنُ عَمَّارٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا الرَّبِيعُ بْنُ بَدْرٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو الزُّبَيْرِ ، عَنْ جَابِرٍ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : " إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ صُلِّيَ عَلَيْهِ وَوَرِثَ."

ئەو حديثة صـحيح كراوە بەڵام سـەنەدی ضـعيفە چونكە، [الرَّبِيعُ بْنُ بَدْرٍ] متروكە .

- ابن معين دەڵێت ضعيف
- النسائي دەڵێت متروك
- الدار قطني دەڵێت متروک
- ابو حاتم الرازي، ضعيف الحديث
- ابن حجر دەڵێت متروک
- ابو الفتح الأزدي دەڵێت متروك
- ابو داودالسجستانی دەڵێت ضعيف
- بۆيە لاوازە گەرچی تصحيحيان كردبێتن

هەروەها لەسنن ئەبی داود هاتوە بەهەمان شێوە لەڕێگەی محمد بن ئیســحاق ەوە ســەنەدی بێهێزە، وە لەمســند الدارمی لەڕێگای أشعث ئەویش ضعیفة.

**کێشەی منهجی خلف ئەوەیە حدیثی ضعیف و منکر بە متابعەو شەواهد تصحیح دەکەن!**

وە حدیثێکی ترمان هەیە لە ســنن الترمزی لەڕێگای مغیرة بن الشـعبة ﵁ ، [ .... وە منداڵیش نوێژی لەسـەر دەکرێت]، سـەنەدی صحیحة.

- ئیمامی الترمزی لە جامع دەڵێت : کارکردن بەو حدیثة لەلایەن کۆمەڵێک ئەهلی علم لەهاوەڵان و کەســانی تریش دەڵێن: نوێژ لەســەر منداڵ دەکرێت ئەگەر دەریش نەچوو بێتن بەڵام، پاش ئەوەی بزانرێت کە ئەو منداڵە درووســت بووە ئەوانیش ئیمامی ئەحمد و ئیسحاق بن ڕاهویە(١).
- وەهەندێکی تر لەئەهلی علم دەڵێن: نوێژ ناکرێت لەســەر منداڵ هەتـاوەکو نەبێـت ئەوانیش ئیمامی ســفیـان الثوری ، ئیمامی شافعی(٢).
- وەهەنـدێک لە ئەهلی علم بۆ ئەوە دەچن کەوا منداڵ ئەگەر بوو مرد ئەوا میراتی لەسـەر دەچەسـپێت ئەوانیش (ئیمامی سـفیان و ئەوزاعی و شافعی...)(٣).

(١) سنن الترمزی حدیث ١٠٣١

(٢) الترمزی ، ١٠٣٢

(٣) عون المعبود ، شەرحی حدیث ژمارە ، ٣١٨٠

**دوانزەیەم: نوێژ ناکرێت لەسەر کەسێک خۆی بکوژێت**

إمامی النسـائی هێناویەتی بەژمارە ١٩٦٤ بەم شـێوە: أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ ، قَالَ : أَنْبَأَنَا أَبُو الْوَلِيدِ ، قَالَ : حَدَّثَنَا أَبُو خَيْثَمَةَ زُهَيْرٌ ، قَالَ : حَدَّثَنَا سِمَاكٌ ، عَنِ ابْنِ سَمُرَةَ ، أَنَّ رَجُلًا قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : " أَمَّا أَنَا فَلَا أُصَلِّي عَلَيْهِ".

واتە: کەسێک خۆی کووشت بەنووکی تیر ، رَسُولُ اللهِ ﷺ : " فەرمووی ، من نوێژی لەسەر ناکەم"[1].

لە ڕیوایەتی مسلم دەفەرموێ : کەسێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ خۆی کوشتبوو بە نوکی تیر ڕەتی کردەوە نوێژی لەسەر بکات. [ مسلم، ٩٧٨]

**زانایان لەم باسەدا ڕاجیاییان هەیە:**

بەشـێک لە ئەهلی علم دەڵێن: نوێژ دەکرێ لەسەر هەموو کەسـێکی ئەهلی قیبلە، وەلەسـەر قاتلی نەفسـیش، ئەوەش قەولی سفیان الثوری، ئیسحاق بن ڕاهویەیە.

ئیمامی ئەحمد دەڵێت : ئیمام نابێت نوێژ بکات لەسـەر قاتلی نەفس، بەڵام کەسانی تر نوێژی لەسەر دەکەن[2].

وە ئیمامی عمر بن عبدالعزیز و ئەوزاعی دەڵێن: نوێژی لەسـەر ناکرێت بەهۆی سەر پێچیەکەی.

وە ئیمامی حسـن بصری ، ئیبراهیم النخعی ، ئیمامی قتادە، ئیمامی مالك بن أنس و ئیمامی شـافعی کۆڕایی زانایان لەگەڵ ئەوەن نوێژی لەسەر بکرێت ، وە وەڵامی ئەو حدیثەشیان داوەتەوە بەوەی

(١) ابی داود ، ٣١٨٥ ، ابن ماجە ، ١٥٢٦ وە مسند احمد

(٢) جامع الصحیح للترمزی ، حدیث ،١٠٦٨

بۆیە پێغەمبەر نوێژی لەســەر نەکردووە لەبەر خەڵک بۆئەوەی کاری واناکەن وە ڕێگـای دا هـاوەڵانی نوێژی لەســەر بکەن وەک چۆن لەســەرەتا نوێژی لەســەر قەرزدار نەدەکرد دەیفەرموو: "صـلوا علی صاحبکم" بەڵام دواتر نوێژی لەسەر کرد .

وە قاضــی دەڵێت: مەزهەبی تەواوی زانایان لەســەر ئەوەیە نوێژی لەســەر بکرێ لەســەر محدود و مرجوم و قاتل النفس و ولد الزنا.

وە ئیمامی الزهری دەڵێـت نوێژ لەســەر کەســی ڕەجم کراو ناکرێ وە لەسەر کوژراو بە قصاص دەکرێت(١).

**سێزدەیەم: ئایا نوێژ دەکرێ لەسەر کەسی قەرزدار؟**

حـدیثێک هەیە (ئیمامی النســائی) و ئەبو داود لە ســمرة بن جندب ریوایەتیان کردووە دەفەرموێ، ئێمە لە گەڵ پێغەمبەر بووین ﷺ لەســەر جەنازەیەک ، لەڕیوایەتی (أبو داود) دەڵێت ووتاری بۆ داین ، فەرمووی لێرەدا کەســێک هەیە لەبنی فلان کەس وەڵامی نەداوە جاری دووەم فەرمووی لێرەدا کەسێک هەیە لەبنی فلان کەس وەڵامی نەبوو دواتر یەکێک هەســتاو فەرمووی بەڵێ ، ئینجا پێی گووت چ شــتێک وای لێکردی لەجاری یەکەم دا وەڵامم نەدەیەوە چونکە من بۆ هیچ شــتێک بانگتان ناکەم تەنها خێر نەبێت ، ئینجا فەرمووی هاوەڵەکەت ڕاگیراوە لەسەر قەرزەکەی. (مەبەستی ئەوەیە ڕاگیراوە لە چوونە ژوورەوە بۆ بەهەشت).

(١) عون المعبود، شەرحی حدیث ٣١٨٥

تحقيق:

ئەم حدیثة سەنەدی مقالی لەسەرە چونکە ئیمامی بخاری دەڵێت: نەم زانیوە سمعان گوێی لە سمرة بو بێت.

وە ئیمامی النسائی دەڵێت: نەزانراوە الشعبی گوێی لە سمرة بو بێت وە نە السمعان گوێی لە سمرة بوو بێت، هەروەها حافظ المنذری هەمان قسەکانیان دووبارە دەکاتەوە.

لە ڕیوایەتێک ئیمامی ئەبو داود هێناویەتی: لە ئەبو موسا الأشعری ﵁ دەفەرموێ ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "گەورەترین تاوان لای الله دوای کبائر کەوا نهی لێکراوە ئەوەیە یەکێک بمرێت و قەرز دار بێت وە هیچ شتێکی بۆ دانەوەی قەرزەکە نەکردبێت".

سەنەدی بێ کێشەیە وە منذری سکوتی لێ کردووە واتە تصحیح واللە أعلم، بەڵام هەندێک تضعیفیان کردووە.

حدیثێکمان هەیە کەوا هەریەک لە ئیمامی بخاری و مسلم و ئەبی داود و الترمزی ڕیوایەتیان کردووە، لە هاوەڵی بەڕێز جابر بن عبدالله ﵄، دەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتا نوێژی لەسەر کەسێک نەدەکرد ئەگەر قەرز دار بوایە ، مردوویەکیان بۆ هێنا فەرمووی ئایا قەرز دارە؟ گووتیان بەڵێ ، دوو دینار، فەرمووی دەی نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، بەڵام دواتر کاتێ خوای تعالی فتوحاتی کردەوە بەڕووی دا، فەرمووی من لەهەموو کەس لەپێشترم بۆ ئیماندار هەریەک قەرزێکی لەسەر بێت و جێی هێشتبێت ئەوا دانەوەی لەسەرمنە ئەوەی ماڵی جێهێشت بۆ میراتگرەکانیەتی.

لەکۆتاییدا حدیثة کانی هاتوون لە صحیح و مسندەکان لەسەر نەکردنی نوێژ لەسەر قەرز دار هەموویان حوکمیان نسخ بۆتەوە بە حدیثی [أنا أولى بكل مؤمن من نفسه] کەوا بخاری و مسلم و أبي داود و الترمزي وأحمد هێناویانە.

# كتاب النكاح

**یەکەم: کەسێک کچێک بخوازێ پێش دخول طلاقی بدا جائیزە دایکی بێنیت؟**

حدیثێکمان هەیە ئیمامی الترمزی ڕیوایەتی کردووە لە کتاب النكاح بەم شێوە:

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ لَهِيعَةَ ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: " أَيُّمَا رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةً، فَدَخَلَ بِهَا فَلَا يَحِلُّ لَهُ نِكَاحُ ابْنَتِهَا، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ دَخَلَ بِهَا فَلْيَنْكِحِ ابْنَتَهَا، وَأَيُّمَا رَجُلٍ نَكَحَ امْرَأَةً، فَدَخَلَ بِهَا، أَوْ لَمْ يَدْخُلْ بِهَا فَلَا يَحِلُّ لَهُ نِكَاحُ أُمِّهَا".

واتە: هەر پیاوێک ژنێک بهێنێت دخولی پێبکات حەڵاڵ نابێت بۆی کچەکەی بخوازێت بەڵام ئەگەر دخولی پێ نەکات بۆی هەیە کچەکەی بخوازێت، وە هەر پیاوێک ژنێک بهێنێت ئەگەر دخولی پێ بکات یان نا بۆی حەڵاڵ نابێت نیکاحی دایکی[1].

لەڕووی سەنەدەوە: ئەم حدیثة ضعیفة چونکە [عبدالله بن لهيعه]ی تێدایە، ئەهلی حدیث زۆر بەیان بەلاوازیان داناوە.

بیهقی دەڵێت: "ئیجماعی زانایانی لەسەر ئەگەر حدیثێک ابن لهيعه بەتەنها ڕیوایەتی بکات ضعیفە، وەلێرەشدا ئیمامی الترمزی بەتەنها ریوایەتی کردووە". هەروەها [عمرو بن شعیب عن أبيه عن جده]، ئەهلی حدیث لە متقدمین بەپلەی حسن قبوڵی دەکەن، وە ئیمامی ترمزی دەڵێت سەنەدی بێهێزە و ضعیفة انتهى.

---

(١) سنن الترمزی، ١١١٧

ئیمامی أبو عیســی الترمزی دەڵێت : "کـارکردن بەوە لای زۆربەی ئەهلی علمە دەڵێن ، ئەگەر پیـاو ئـافرەت بخوازێـت پێش دخول تەڵاقی بدات بۆی حەڵاڵە نیکاحی کچەکەی واتە خواستنی ، ئەگەر پیـاو کچێک بخوازێـت پێش دخول تەڵاقی بـدات نیکـاحی دایکەی بۆ حەڵاڵ نیە بەهۆی ئەم ئایەتەوە {وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ}".

ئەوەشـیان قەولی هەریەک لە ئیمامی شـافعی ، ئیمامی ئەحمد و ئیمامی ئیسحاق بن ڕاهویەیە[١].

**دووەم: ژن و پیاوێک زەواجیان کردووە ئافرەتێک بڵێت شـیرم پێتان داوە تەڵاق دەدرێ یان دەمێنێتەوە؟**

إمامی الترمزی هێناویەتی بەژمارە ١١٥١ ، أبواب الرضـاعة: "حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ ، قَالَ : حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ ، عَنْ أَيُّوبَ ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ ، قَالَ : حَدَّثَنِي عُبَيْدُ بْنُ أَبِي مَرْيَمَ ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ الْحَارِثِ، قَالَ : وَسَـمِعْتُهُ مِنْ عُقْبَةَ، وَلَكِنِّي لِحَدِيثِ عُبَيْدٍ أَحْفَظُ، قَالَ : تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَـوْدَاءُ، فَقَالَتْ : إِنِّي قَدْ أَرْضَـعْتُكُمَا. فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ : تَزَوَّجْتُ فُلَانَةَ بِنْتَ فُلَانٍ، فَجَاءَتْنَا امْرَأَةٌ سَـوْدَاءُ، فَقَالَتْ : إِنِّي قَدْ أَرْضَـعْتُكُمَا وَهِيَ كَاذِبَةٌ. قَالَ : فَأَعْرَضَ عَنِّي. قَالَ : فَأَتَيْتُهُ مِنْ قِبَلِ وَجْهِهِ، فَأَعْرَضَ عَنِّي بِوَجْهِهِ، فَقُلْتُ : إِنَّهَا كَاذِبَةٌ. قَالَ : " وَكَيْفَ بِهَا وَقَدْ زَعَمَتْ أَنَّهَا قَدْ أَرْضَـعَتْكُمَا ؟ دَعْهَا عَنْكَ."

عقبة بن الحارث رضي الله عنه دەفەرموێت: ئافرەتێکم خواســت دواتر ئـافرەتێکی ڕەش هـات و گووتی من شــیرم بەئێوە داوە ، منیش چوومە لای پێغەمبەر ﷺ، پێم گووت من کچی فڵان و فلانـم

(١) جامع الصحيح حديث : ١١١٧

خواستوه ئافرەتێکی ڕەش هاتوو گووتی من شیرم بەئێوه داوه ، بەڵام ئەو درۆ دەکات دەڵێت پێغەمبەر ڕووی لێ وەر گێڕام ، دواتر چوومە ڕووەکەی تری پێم گووت ئەو درۆ دەکات ، فەرمووی: چۆن دەبێت لەکاتێکدا ئەو دەڵێت من شیرم بەئێوه داوه لێی جیابەوه یان وازی لێبێنه[1].

ئیمامی الترمزی لە سنن دەڵێت: "کارکردن بەوه لای کۆمەڵێک لە هاوەڵی پێغەمبەر غیری ئەوانیش ڕێگەیان داوه بەشەهادەی یەک ئافرەت لەشیر پێدان".

وە ابن عباس دەڵێت: "دەکرێ و ڕێگە پێدراوه شهادەی یەک ئافرەت بۆ شیر پێدان وە سوێندیشی لێ وەر دەگیرێت".

ئەوەشیان هەریەک لە ئیمامی ئەحمد و ئیمامی ئیسحاق بن ڕاوهویه پێیان وەر گرتوه.

وە هەندێک لەئەهلی علم دەڵێن شهادەی ئافرەتێک بەتەنها قبوڵ ناکرێت بەڵکو دەبێت زیاتر بێت، لەوانیش ئیمامی شافعی[2].

وە ئەبوعبید دەڵێت: "پێویستە لەسەر پیاوەکە جیابێتەوەو وازی لێبێنێت نابێت حاکم حوکم بدات".

وە ئیمامی مالك دەڵێت: "شهادە قبوڵ ناکرێت لە شیرپێدان حتی دوو ئافرەت نەبن"[3].

(١) بخاری ،٨٨،٢٠٥٢،٢٦٤٠، ابی داود، ٣٦٠٣ ،النسائی ، ٣٣٣٠، الدارمی ،٢٣٠١ ، مسند احمد بن حنبل.

(٢) جامع الصحیح للترمزی ، حدیث : ١١٥١

(٣) عون المعبود : شەرحی حدیث ، ٣٦٠٣

**سێیەم: ئافرەتێک مێردەکەی بمرێت بەڵام حملی هەبێت، ئایا دەتوانێت شووبکات؟**

**لە ئەصل دا:** عیددەی ئافرەتێک کەمێردی بمرێت چوار مانگ و دەڕۆژ بەهەموو پێوەرێکی قورئان و سوننەت.

**بەڵام استثناء:**

حدیثێکمان هەیە ئیمامی ترمزی ڕیوایەتی کردووە، لە أبو السنابل بن بعکك بن الحارث وە دەفەرموێت: سبیعة الأسلمیة دوای وەفاتی مێردەکەی بەماوەی بیست و سێ یان بیست و پێنج ڕۆژ سکەکەی دانا بۆیە خۆی ڕازاندەوە بۆ زەواج بەڵام گوتیان نابێت وەبۆت نیە، ئەو باسە بەپێغەمبەر گەیشت فەرمووی : "ئەگەر بتەوێ ئەوا ماوەکەت تەواو بوە "[١].

حدیثێکی تر: سلێمان بن یسار دەڵێت : أبو هریره و ابن عباس و عبدالرحمن بن سلمه باسی ئافرەتی مێرد مردوویان کرد کەوا حملی هەبێت و لەکاتی وەفاتی سکەکەی دابنێت، عبدالله بن عباس فەرمووی: عیددەکان تەواو دەکات واتە مردن و دانانی سک. بەڵام ابو سلمه گووتی: بەڵکو لەکاتی دانانی سکەکەی ماوەی کۆتایی دێت. ئەبو هریره دەڵێت: من لەگەڵ قەولی کوڕی برام ئەبو سلمەم. دواتر هەواڵ دەنێرن بۆ ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ئەویش دەفەرموێ: "سبیعەی ئەسلمی سکی دانا پاش وەفاتی مێردی چونە لای پێغەمبەر پرسیاریان لێکرد ئەویش ڕێگەی دا زەواج بکات "[٢].

(١) سنن الترمزی ، کتاب الطلاق :١١٩٣ النسائی ، ٣٥٠٨ ابن ماجه ، ٢٠٢٧ الدارمی ،٢٣٢٧ مسند احمد.

(٢) بخاری ، ٤٩٠٩،٥٣١٨، مسلم ،١٤٨٥، النسائی ، ٣٥١٠ ، ٣٥١٢،٣٥١٣،٣٥١٤،٣٥١٥،٣٥١٦، موطأ مالك، ١٧٢٥.

ئیمامی الترمزی دەڵێت: "کارکردن بەو باسە لای زۆربەی ئەهلی علمە لەهاوەڵان و غەیری ئەوانیش ، بەوەی ئافرەتی حاملەی مێرد مردوو کاتێ سکی دانا ماوەی تەواو دەبێت وەئەگەر بێت و عیدەی تەواو نەکردبێت، ئەوەشیان قەولی هەریەک لە (سفیان الثوری ، شافعی ، أحمد ، ئیسحاق)ە[1].

وە ابن شهاب الزهری دەڵێت: "دەکرێت تەنانەت لەکاتێک دا بێت شووبکات کەوا لە نفاس واتە پاک بوونەوەی دوای منداڵ بوونیش تەواو نەبوو بێت بەو مەرجەی نابێت لێی نزیک بێتەوە هەتا پاک دەبێتەوە"[2].

(١) سنن الترمزی ،١١٩٣

(٢) سنن أبی داود ، کتاب الطلاق

# كتاب الحدود

## یەکەم: پووختەیەک لەڕەجم

باسی رەجم کردن یەکێکە لەباسە گرنگەکان کەوا جێگیرە و حەدێکی شەرعیە و لەئیسلامدا بوونی هەیە، وە ڕووی زۆرێک لە منافق و بەناو موسڵمانە عەقڵانیەکانی دەرخستوە هەم لەکۆن وە هەمیش لەئێستادا چونکە ڕەفزی ئەو سزا شەرعیە دەکەنەوە کەوا نصي ثابت و مطلقي لەسەرە وەبگرە اجماعي هاوەڵانی لەسەرە.

وەک لەم آثرة صحیحەی خلیفەی بەڕێز عمر بن الخطاب (رضی الله عنه وارضه):

قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه)، وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ (صلى الله عليه وسلم): إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا (صلى الله عليه وسلم) بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ (صلى الله عليه وسلم) وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ تعالى، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وَإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى -إِذَا أَحْصَنَ- مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوِ الِاعْتِرَاف.

عومەری کوڕی خطاب لە کاتێکدا کە لەسەر دوانگەی پێغەمبەری خوا دانیشتبوو وتی: بێگومان خوا -محمد-ی بەحەق ڕەوانە کردووە و قورئانی بۆ ناردووە لەوەی کە خوا ناردبوویە سەری ئایەتی بەردە باران کردنی [داوێن پیس] بوو خوێند بوومانەوە ولێی حاڵی بووبووین و تێی گەیشتبووین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی [پیاو و ژنی] داوێن پیسی بەرد باران کردووە و ئێمەش پاش ئەو کردومانە، ئەترسم لەوەی گەر ڕۆژگار بە خەڵکی تێپەڕ

بکات و درێژ بکێشـێت کەسـی ئەو تۆیان لێ ڕاسـت بێتەوە و بڵێ: لەنامەی خوای باڵادەسـتا بەردە باران کردنی تیا نیە ئینجا سـەریان لێبشـێوێـت و گومڕابن بەوازهێنـان لـە حوکمێـک کە خوا دای بەزاندوە، بەڕاسـتی بەردەباران کردن لە قورئاندا حەقێکی نەگۆڕە لەسەر کەسێک کە زینای کردبێت، ئەگەر ژنی شووکردو یان پیاوی ژن هاوردو بێت بەو مەرجەی [چوار] شـایەت هەبێت، یان سـک پڕبوون، یان دان پیانان(١).

**دەڵێم : ئیمامی عمر و اجماعێکی سکوتی هاوەڵانی ئامادە نەقڵ دەکات بەوەی کەلەوێدا ئامادە بوون وە شاهێد بوون لەسەری بەڵێ بلفعل هەم پێغەمبەر و هەمیش دوای ئەو رەجمیان کردووە بۆیە رەدد کردنەوەی ئەم باسە هەستیارە لەئیسلام دەرتدەکات و پێویستی بە شهادەی نوێیە.**

عَنِ الشَّيْبَانِيِّ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بنَ أبِي أوْفَى: هلْ رَجَمَ رَسولُ اللَّهِ ﷺ؟ قالَ: نَعَمْ، قُلتُ: قَبْلَ سُورَةِ النُّورِ أمْ بَعْدُ؟ قالَ: لا أدْرِي.

واتە الشَّـيْبَانِيِّ ، دەڵێت پرسـیارم کرد لە (عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى)، ئایا رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ رەجمی کردووە ؟ فەرمووی بەڵێ، گووتم پێش سورەتی النور یان دوای؟ فەرمووی نازانم(٢).

**بۆ زیـاتر چەسـپـانـدن و جێگیر بوونی ئەم سـزا شـەرعیە دەگەڕێینەوە بۆ حدیثێکی تری صحیح کەوا هاتووە بەم شێوە:**

عن عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ نَبِيُّ (ﷺ) إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ كُرِبَ لِذَلِكَ وَتَرَبَّدَ لَهُ وَجْهُهُ، قَالَ: فَأُنْزِلَ عَلَيْهِ ذَاتَ يَوْمٍ فَلُقِيَ

(١) مسـلم ، ١٦٩١، بخاری ، ٧٣٢٣، أبي داود ٤٤١٨، الترمزي ،١٤٣٢،١٤٣١ ، ابن ماجة ، ٢٥٥٣ ، احمد.

(٢) متفق عليه : البخاري ٦٨١٣ ،ومسلم ١٧٠٢.

كَذَلِكَ، فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْهُ قَالَ: (خُذُوا عَنِّي، فَقَدْ جَعَلَ اللهُ لَهُنَّ سَبِيلًا: الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ، وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ، الثَّيِّبُ جَلْدُ مِائَةٍ ثُمَّ رَجْمٌ بِالْحِجَارَةِ، وَالْبِكْرُ جَلْدُ مِائَةٍ ثُمَّ نَفْيُ سَنَةٍ).

واتە: (عبادە)ی کوڕی (صامت) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) (وحی) بۆ دەهات ناڕەحەت و سەغڵەت دەبوو ڕەنگی تێک دەچوو، ڕۆژێکیان (وەحی) دابەزییە سەری بەهەمان شێوە سەغڵەت بوو گۆڕا، کاتێ لەسەری لاچوو فەرمووی: "لێم وەرگرن خوا ڕێگە چارەی بۆ دانان، ژن و پیاوی داوێن پیس وەکویەک و کچ و کوڕی داوێن پیسیش وەکو یەک، پیاوی ژن هاوردووی داوێن پیس و ژنی مێرد کردووی داوێن پیس سەد داریان لێبدرێت و پاشان بەردباران بکرێن، کوڕی ژن نەهاوردوو کچی شوونەکردویش سەد داریان لێبدرێت و ساڵێکیش دوور بخرێنەوە"[1].

ئیمامی الترمزی دەڵێت : "کارکردن باو باسە لەلایەن کۆمەڵێک لە هاوەڵانەوە وەک : (عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ، وە کەسانی تریش وە هەروەها قەولی ئیسحاق بن راهویەیە)".

وە کۆمەڵێک لەئەهلی علم لەهاوەڵان وەک ئیمامی ئەبوبکر و ئیمامی عمر دەڵێن جەڵدیان لێنادرێت بەڵکو تەنیا ڕەجم دەکرێن وە بەڵگەشیان بۆ ئەوە حدیثی ماعز ە کەوا کاتێک اعترافی کرد ڕاستەوخۆ فەرمانی ڕەجمی بۆ دەرکرد، هەروەها ئەوەش قەولی

(١) مسلم، ١٦٩٠، أبي داود ،٤٤١٥، الترمزي ١٤٣٤، ابن ماجه ، ٢٥٥٠، الدارمي ٢٣٧٢ ، أحمد ، ٢٢٦٦٦.

هەریەک لە (ئیمامی سُــفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّــافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ) ە[١].

وە هاوەڵی بەڕێز اجماعێکی تری خلفائي راشدين نەقڵ دەکات لەسەر ئەو باسە قال ابْنِ عُمَرَ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ضَرَبَ وَغَرَّبَ، وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ ضَرَبَ وَغَرَّبَ، وَأَنَّ عُمَرَ ضَرَبَ وَغَرَّبَ

واتە پێغەمبەر ﷺ جەڵدی لێداو دووری خستۆتەوە وە ئەبی بکر و عمر یش[٢]...

مەبەست لەوەیە کاتێ کچ و کوڕ زینا دەکەن دەبێت (نفی) یەک ساڵ بکرێن واتە دووربخرێنەوە لەو شوێنە وە سەد جەڵدیان لێبدرێت ، زۆربەی ئەهلی علم لەنێو صحابەو تابعین کاریان پێکردووە وەک: (أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعَلِيٌّ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، وَأَبُو ذَرٍّ، وە کەسانی تریش ، وە هەریەک لە قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ وَإِسْحَاقَ)[٣].

**وە ئەگەر دووکەس زینایان کرد وەک کوڕێکی بێ ژن و ئافرەتێک؟**

حدیثمان هەیە لە أبی هریره رضي الله عنه دەڵێت ، دووکەس سکاڵایان هێنا بۆلای پێغەمبەر یەکێکیان فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا سوێندت دەدەم حوکم بکە لەنێومان بەکتابی الله ، ئەویتریان کە تێگەیشتوو تر بوو فەرمووی بەڵێ بەڵام ڕێگەم بدە قسە بکەم ؟

(١) جامع الصحيح للترمزي ١٤٣٤.

(٢) سنن الترمزي ١٤٣٨

(٣) سنن الترمزي ١٤٣٨

فەرمووی بڵێ ، گووتی کوڕەکەی من لای ئەو پیاو کار دەکات زینای لەگەڵ ژنی کردووە هەواڵیان پێدام کەوا لەسەر کوڕی من ڕەجم کردنە بۆیە منیش سەد مەڕو خزمەتکارێکم وەک فدیە پێی دا دواتر گەیشتم بەکەسانی ئەهلی علم پێیان گووتم کەوا لەسەر کوڕەکەت سەد جەڵد و ساڵێک دوورخستنەوە یەو لەسەر ژنەکەش ڕەجمە ، پێغەمبەر فەرمووی سوێند بەالله حوکم دەکەم لەنێوتان بە کتابی الله سەبارەت بە سەد مەڕو خادمەکە بۆت دەگەڕێتەوە وە کوڕەکەشت سەد جەڵد و ساڵێک دوورخستنەوەیە وە ئەی أنیس بڕۆ لای ژنەکە گەر ئیعترافی کرد ڕەجمی بکە ئەوە بوو ئیعترافی کرد و ڕەجم کرا[1].

**لەکۆتاییدا:**

رەجم حوکم و حددێکی شەرعیە بە ئیجماعی هاوەڵان و شاهێدی خلفائي راشد وە دەیان حدیثي صریح و صحیح و ثابت لەسەری هاتووە لەکتوبەکانی حدیث لەهەموو کتێبەکانی تایبەت بە حدیث کتابێکی تایبەتیان داناوە بەناونیشانی [كِتَابٌ : الْحُدُودُ ]لەنێویدا بابێکی تایبەت دانراوە بەناوی [رجم] کۆمەڵێک باس و بەسەرهاتی رەجم تێیدا هاتووە وە لەنێو مشهورترین باسەکان رەجم کردنی [ماعز] کەوا بە پلەی تواتر حدیثەکان هاتوون وە رەجمی یهودی ئەوکات وە جلد لێدانی کوڕ و رەجمی ئافرەتی زیناکار.

(١) مسلم ١٦٩٨،١٦٩٧، البخاري ، ٢٣١٤ ، أبي داود،٤٤٤٥ ، الترمزي ،١٤٣٣ ، النسائي ٥٤١٠،٥٤١١.

**دووەم: حدی لواط ئەوانەی کاری نێربازی دەکەن**

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللهَّ ﷺ: "مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ".

له ابن عباس ﷺ دەفەرموێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر یەکێکتان بینی کاری قەومی لوطی دەکرد ئەوا فاعل و مفعول به بکوژن". (واته هەردوولایان بکوژن).

**دەڵێم: ئەم سەنەدی کەمێک مقالی لەسەرە بەهۆی [عمرو بن أبي عمرو ميسرة ] بەشێک لە زانایان توثیقیان کردووە وە بەشێک بەلاوازیان داناوە، هەریەک لە ئیمامی ئەحمد بن حنبل ، و ابو حاتم الرازي و ابو زرعةالرازي و ابي داود السجستاني و ابن حجر و الذهبی توثیقیان کردووه.**

وە حدیثێکی ترمان هەیە هەیە ئیمامی الترمزی هێناویەتی لە جابرەوە بەم شێوە لە رَسُولُ اللهَّ ﷺ : " إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي عَمَلُ قَوْمِ لُوطٍ".

واتە: ئەوەی من زۆر ترسم هەیە لەسەر ئومەتەکەم کاری قەومی لوطە[1].

[ئەم حدیثة تحسین کراوە] لەلایەن معاصرین بەڵام لەسەنەدی [عَبْدِ اللهَّ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ]، بەشێکی زۆر لە ئەهلی علم بەلاوازیان داناوە وەک:

- ابن المدینی دەڵێت، یحیی بن سعید و مالك هیچیان لێ ڕیوایەت نەکردووە.

(١) ابن ماجه ،٢٥٦٣، الترمزي ، ١٤٥٧، أحمد ،١٥٠٩٣

- احمد بن حنبل دەڵێت منكر الحديث.
- ابو حاتم ، لايحتج به.
- ابن معين ، ضعيف.
- النسائى والدارقطنى، ليس بالقوى وە ضعيف.

**لەبارەی شێوازی حددەکەی:**

ابْنُ خُثَيْمٍ ، قَالَ : سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ وَمُجَاهِدًا يُحَدِّثَانِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، فِي الْبِكْرِ يُؤْخَذُ عَلَى اللُّوطِيَّةِ، قَالَ : يُرْجَمُ[1]. (سەنەدی حسن ە، والله أعلم).

هەریەک لە سعيد بن جبير و مجاهد رحمهما الله تعالى لە هاوەڵی بەڕێز ابن عباس نەقڵ دەکەن، کەوا حوکمی نێرباز رەجم واتە بەرد باران کردنە.

ئیمامی الترمزي دەڵێت : زانایان دەڵێن، ڕەجمە ئەگەر ژنی هێنابێت یان نەیهێنابێ، لەوانەش هەریەک لە (ئیمامی مالك و ئیمامی شافعی و ئیمامی ئەحمد و ئیسحاق بن راهويه).

وە هەندێکی تر دەڵێن، حوکمەکەی حوکمی زینایە لەوانەش: (حَسَنُ الْبَصْرِيُّ، وَإِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ، وَعَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ، وە ئیمامی سفيان الثورى و ئەهلی کوفە)[2].

هەروەها ابن ماجە هێناویەتی لەحدیثێکی ضعيف کەوا فەرمان کراوە لەسەرەو بۆ خوارەوە فڕێ بدرێت.

هەروەها وارد بوە لە ئیمامی علی کەوا سووتاندوونی.

(١) أبي داود، ٤٤٦٣

(٢) سنن الترمزي ١٤٥٦

لەکۆتاییدا دەڵێم: لەهەموو حاڵەکان ســـزای نێرباز کوشـــتنە واتە ئیجماعی هەموو زانایانی لەهاوەڵان و غیری ئەوان لەسەرە کەوا نێرباز دەکوژرێت ، متفقن لەسەر ئەوە تەنیا لەشێوازی کوشتنەکەی اختلافیان هەیە کەوا زۆرینەی دەڵێن ســـزای رەجم کردنە واتە بەرد باران دەکرێت وە هەندێ دەڵێن لەشوێنی بڵند فڕێ ئەدرێ.

# كتاب الصياد

## پووختەی ڕاو کردن

کۆکراوەی هەموو حدیثەکان لەسەر ئەم باسە کەوا هەریەک لە، ئیمامی البخاري لە [صحيح ٥٤٧٧،٥٤٧٦،٥٤٧٥،٢٠٥٤،١٧٥]، مسلم لە [صحيح ١٩٢٩]، أبي داود لە [سنن ،كتاب الصياد، ٢٨٥٤،٢٨٤٩،٢٨٤٧]، الترمزي لە [سنن ابواب الصيد، ١٤٧١،١٤٧٠،١٤٦٩] و النسائي [٤٢٦٥،٤٢٦٤،٤٢٦٣] و ئیمامی ئەحمد لەمسند.

حدیثەکان هەموویان لە [ عدى بن حاتم ] [ أبو ثعلبة الخشني]، ڕیوایەت کراوە وە یەکێکیان جابر ڕیوایەتی کردووە بەڵام مقالی لەسەرە، عدي بن حاتم ﵁ ، پرسیاری دەربارەی ڕاو کرد لە پێغەمبەر ﷺ ، ڕیوایەتەکان لەفظەکانیان جیاوازە بەڵام پوختەکەی بەم شێوەیە:

کاتێک سەگەکەت کەوا فێرت کردووە بۆ ڕاو ڕۆیشت بەرەو ڕووی ئەگەر گرتی بیخۆ، بەو مەرجەی سەگێکی تر لەگەڵی نەبێت چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگی خۆت هێناوە نەک غیری ئەو ، عدي دەڵێ، گووتم ئەگەر کووشتی؟ فەرمووی ئەگەر کوشتیشی، بەڵام ئەگەر خواردی ئەوا مەیخۆ چونکە لەوانەیە بۆ خۆی ڕاوی کردبێت.

وە أبو ثعلبة الخشني پرسیاری، بەهەمان شێوە وەڵامەکەشی بەهەمان شێوە.

وە پرسیاریان کرد دەربارەی ڕاو بە (تیر و رم) فەرموی ناوی خوای لەســەر بێتە وە ئەوەی بە نووکی پێکرا بیخۆن بەڵام ئەوەی بە پشــتی مەیخۆ چونکە پیســە ، وە پرســیاریان کرد ئەگەر وون بوو؟ فەرمووی، ئەگەر پێکات دواتر وون بوو ڕۆژێک یان دوو ئەگەر دۆزیتەوە وە شــوێنی تیری تۆی پێوە بوو بەتەنها بێخۆ ئەگەر تێک نەچوو بێت ، وە فەرمووی ئەگەر لێت وون بوو دواتر دۆزیتەوە بەڵام لەئاو بوو مەیخۆ چونکە خنکاوە. (ئەوە کۆکراوەی هەموو فەرمودەکان بوو).

ئیمامی الترمزي دەڵێت : "کارکردن بەو باسە لەلایەن کومەڵێک لە ئەهلی علم لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ و جگە لەوانیش دەربارەی ڕاوکراو و سەربڕاو ئەگەر بکەوێتە نێو ئاو ناخورێت ، وە هەندێکیان لەبارەی سەربڕاو دەڵێن:

ئەگەر ملی بڕا واتە قوڕقوڕاگەی دواتر کەوتە ناو ئاوەوە و مرد ئەوا دەخورێت ئەمەش قەولی عَبْدِ اللهَّ بْنِ الْمُبَارَكِ".

**وە جیاوازی کەوتۆتە نێوان ئەهلی علم لەبارەی سەگی ڕاو:**

ئەگەر هاتوو لەنێچیرەکەی خوارد ، زۆرینەی دەڵێن: ئەگەر سەگ لەنێچیرەکەی خوارد ئەوا نابێت بیخۆیت، ئەمیش هەریەک لە (سُــفْيَانَ الثوري، وَعَبْدِ اللهَّ بْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّــافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ)، وە هەندێک لە ئەهلی علل ڕێگەیانداوە ئەگەر سەگ لەو نێچیرە بخوا بیخویت[1].

---

(١) سنن الترمزي ،١٤٧٠

# كتاب الصيام

## ڕۆژووگرتن لە سەفەر: کەسێک لە سەفەر بەڕۆژوو بێت، ئایا دووبارەی دەکاتەوە؟

ڕۆژ وو لەمانگی ڕەمەزاندا واجبێکە دەبێ بکرێ تەنیا بە عوزر نەبێت یەکێک لەوانە سەفەر . جابر بن عبداللە ﵄ دەفەرموێ ، پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەرەو مککە لە ساڵی فتح دا بەڕۆژوو بوو هەتا گەیشتە [كراع الغميم] خەڵکی وەک ئەو بەڕۆژ وو بوون پێیان فەرموو خەڵکی بەهۆی ڕۆژوو زۆر شەکەت بوون ، داوای جامێک ئاوی کرد لەدوای عەسر بوو خواردیەوە خەڵکیش سەیریان دەکرد هەندێکیان شکاندیان و هەندێکی تر هەر بەڕۆژوو بوون، هەواڵ بە پێغەمبەر گەیشت کەهەندێ لەخەڵک بەڕۆژوون ، فەرمووی ئەوانە سەر پێچی کارن[1].

هەروەها دایکی ئیماندارا ن عائشة ﵂ دەفەرموێ: " حمزه بن عمرو الأسلمی پرسیاری ڕۆژووی سەفەری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، کەخۆی بەردەوام بەڕۆژوو دەبوو ، فەرمووی گەر پێت کرا بەڕۆژوو بە گەرنا بیشکێن"[2].

صحابی بەڕێز ئەبو سعید الخدری ﵁ ، دەفەرموێ: "سەفەرمان کرد لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ، هەندێکمان بەڕۆژوو بوو هەندێکی پێ نەبوو ، نە ڕۆژووگر قسەی بە کەسی ڕۆژوو نەگر دەگووت نە پێچەوانەوە"[3].

(١) مسلم، ١١١٤ ، الترمزی ، ٧١٠ ، النسائی ،٢٢٦٣ وە مسند احمد.
(٢) مسلم ،١١٢١،١١١٨، البخاری ، ١٩٤٣،ابوداود ،٢٤٠٢ الترمزی ،٧١١.
(٣) مسلم، ١١١٦،١١١٧ ،الترمزی ، ٧١٢،٧١٣ النسائی ، ٢٣٠٩،٢٣١٠،٢٣١٢ ، مسند احمد.

هەروەها حدیثمان پێگەیشتووە ، لەپێغەمبەرەوە فەرموویەتی: "لیس من البر الصیام فی السفر"[1]. حدیث بەم لفظانە زۆر هاتوون دووبارە بوونەوە مجموعی کتب الستە و کتب التسعة.

**ڕاجیایی زانایان لەسەر ئەم باسەدا:**

ئیمامی الترمزی لە [الجامع الصحیح ] دەفەرموێ: "هەندێک لە ئەهلی علم لە صحابەکانی پێغەمبەر و کەسانی تر پێیان وایە ڕۆژوو نەگرتن لەسەفەر چاکترە تەنانەت هەندێک پێیان وایە ئەگەر کەسێک لەسەفەر بەڕۆژوو بێت دەبێت دووبارەی بکاتەوە، لەوانە هەریەک لە ئیمامی ئەحمد و ئیمامی ئیسحاق بن ڕاهویە ، هەندێکی تر دەڵێن ئەگەر تواناو هێزی هەبوو ڕۆژوو بگرێ باشترەو چاکترە ،لەوانیش هەریەک لە ئیمامی سفیان الثوری ، مالك بن أنس ، عبدالله بن مبارك".

ئیمامی شافعی ، سەبارەت بە فەرمودەی [لیس من البر الصیام فی السفر]، وە کاتێک هەواڵی پێدرا هەندێک بەڕۆژوو بوون فەرمووی: [أولئك العصاة] ئەوە لەکاتێدایە ئەگەر قبوڵی ئەو روخصەتە نەکەن کەوا پێیان دراوە ، بەڵام ئەگەر پێیان وابێت ڕۆژوو لەسەفەر مباحا و بەڕۆژووش بن وەتواناو هێزی ئەوەی هەبێت ، ئەوە لای من پەسندە[2].

(١) الترمزی ٧١٠

(٢) سنن الترمزی ،حدیث ٧١٠

# كتاب الأجارة

## گەر ئاژەڵێک بچێتە نێو بێستان یان باغێک هیچی بۆ نیە؟

ئیمامی ئەبو داود لە [سـنن لە كتاب الأجارة ژمارە ٣٥٦٩، ٣٥٧٠] هێناویەتی لە سـعد بن محيصـة بن مسـعود الأنصـاري، دەفەرموێ: ووشـترێکی البراء بن عازب چوە نێو بێستانی یەکێک و خەراپی کرد بۆ ئەوەش سکاڵا یان بردە لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی لەسـەر خاوەن ماڵ [لەڕیوایەتی تر دەڵێت خاوەن باغ یان بێسـتان] پاراسـتنیەتی بەڕۆژ وە لەسـەر خاوەنی ئاژەڵ پاراسـتنیەتی بەشـەو (لەڕیوایەتی دووەم ئەوەی زیاد کردوە لەسـەر خاوەن ئـاژەڵ هەر شتێک بکات بەشەو ئەبێت زەرەر بژمێرێت).

لەڕووی سـەنەدەوە ابن ماجە و ئیمامی ئەحمد بەهەمان شـێوە ڕیوایەتیان کردوە رجالەکان هەمووی ثقة و ئیمامن تەنیا ئەوە نەبێت هەندێک دەڵێن [سعد] صحابەیە وە بینینی هەبوە وە دەڵێن ریوایەتی مرسل وەک ابن حجر، وە المنذري تضعيفی نەکردووە.

**لەڕووی شەرحەوە: قال في شرح السنة:**

بەشـێک لە ئەهلی علم بۆ ئەوە چوون کەوا ئەگەر ئاژەڵی ماڵی هەر شتێک خەراپ بکات بەڕۆژ لەماڵی کەسی تر هیچ ضمانێکی نیە ، وە ئەوەی خەراپی دەکات بەشـەو ئەوا ضمان لەسەر خاوەنەکەیەتی ، هەموو ئەوانە ئەگەر بێت خاوەنی ئاژەڵ خۆی لەگەڵی نەبێت بەڵام ئەگەر لەگەڵی بێت ئەوا لەسـەریەتی ئەو شـتەی کە خەراپی دەکات ئینجا ئەگەر خۆی لەسەری بۆ بێت یان لەپێشیەوە بێت یان بەدەست

یان بە پێیەکان یان بەڕۆیشتن یان بەوەستاوی ، ئەمەش قەولی ئیمامی مالك و ئیمامی شافعیە[1].

واتە ئەوانەی لەگوندن یان لەشوێنی تر کە مەڕو ماڵاتیان هەیە، ئەگەر بە ڕۆژ زیان بەدەغڵ یان بێستانی کەسێکی تر بکات ئەوا هیچ حەقێکی شـەرعی ناکەوێتە لای خاوەن بێسـتان بەو مەرجەی کەس لەگەڵ ئاژەڵەکان نەبێت، ئەگەر خاوەنەکەی لەگەڵ بێت بەهەموو جۆرێک دەبێت زەرەر بژمێرێت. واللە اعلم.

(١) عون المعبود

# پێرست